جُزء مِن

# كِتَابُ العِلمِ

للإمام أبي خَيثَمة زهَير بن حَرب النّسَائي

١٦٠ - ٢٣٤ هـ

همام الأثري | Telegram
@hamam_alathari

**اللَّهُمَّ أَرِنَا الْحَقَّ حَقًّا وَارْزُقْنَا اتِّبَاعَهُ، وَأَرِنَا الْبَاطِلَ بَاطِلاً وَارْزُقْنَا اجْتِنَابِهِ.**

١ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

بەیانی بکەرەوە بەوەی زانا بیت، یان فێرخوازی زانست بیت، بەیانی مەکەرەوە بەوەی یەکێک لەوانە نەبیت.

: واتە هەمیشە یەکێک لەم دووانە بە : یان خەڵکی فێری زانست بکە، یان خۆت فێری زانست ببە، مەبە بە کەسێک کە یەکێک نییە لەو دووانە، والله أعلم.

٢ - **عون بن عبدالله** ئەڵێت : بە **عمر بن عبدالعزیز**م وت :

ئەوترێت : ئەگەر توانیت ببیت بە زانا ئەوە ببە بە زانا، ئەگەر نەتتوانی ببە بە فێرخوازی زانست، ئەگەر نەشتوانی ببیت بە فێرخوازی زانست ئەوە ئەوانت خۆش بووێ، ئەگەر ئەوانیشت خۆشناوێت ئەوە ڕقت لێیان نەبێت.

عمر وتی : سبحان الله! بەڕاستی الله عز وجل ڕێگەچارەیەکی بۆی داناوە.

٣ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

الله خێری بۆ هەر کەسێک بووێت تێگەیشتووی ئەکات لە دین.

: اللهم تێگەیشتوومان بکە لە دینەکەت.

٤ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

ئەی خەڵکینە ! فێربن، جا ئەوەی فێر بوو با کاری پێ بکات.

٥ - **زر بن حبیش** ئەفەرمووێت :

چووم بۆلای صفوان بن عسال المرادي، وتی : چی هێنایتی بۆ ئێرە؟

وتم : داواکردنی زانست.

وتی : مەلائیکەکان باڵیان ڕائەخەن بۆ فێرخوازی زانست لەبەر ڕازیبوونیان بەو شتەی کە داوای ئەکات.

٦ - **إبن عباس** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

ئەو کەسەی کە خەڵکی فێری چاکە ئەکات هەموو ئاژەڵێک داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەکات، تەنانەت ماسی نێو دەریاش.

٧ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

فێر ببن، چونکە هیچکەس لە ئێوە نازانێت کەی پێویستی پێی ئەبێت.

٨ – **عمر** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

فێر ببن پێش ئەوەی ببن بە پێشەوا.

: واتە پێش ئەوە ببیت بە سەرگەورە و مامۆستای خەڵکی فێری دین ببە، ناکرێت خەڵکی پێت بڵێن مامۆستا و تۆش بە قسەکانی گیرفانی خۆت وەڵامیان بدەیتەوە، بەڵکو ئەبێت بە قورئان و فەرموودە و ئاثاری سەلەف وەڵامیان بدەیتەوە.

٩ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

سوێند بە الله ئەو کەسە شێتە کە فتوا بۆ خەڵکی ئەدات لە هەموو ئەو شتانەی کە پرسیاری لێ ئەکەن.

الأعمش ئەڵێت : الحكم پێی وتم : ئەگەر ئەم ئەثەرەم لێت ببیستایە پێش ئەمڕۆ ئەوە فتوام نەدەدا لە زۆربەی ئەوەی کە فتوام تێدا داوە.

١٠ - **سلمان** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

ئەو زانستەی کە بڵاو ناکرێتەوە وەک ئەو گەنجینەیە وایە کە خێری لێ ناکرێت.

١١ - **مسروق** رحمه الله ئەفەرمووێت :

هێندە زانست بەسە بۆ پیاو کە لە الله بترسێت، وە هێندە نەزانین بەسە بۆ پیاو کە موعجیب بێت بە زانستەکەی خۆی.

**١٢ - إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرموویت :

هیچ کەسێک نییە ڕێگایەک بگرێتەبەر بۆ بەدەستهێنانی زانست ئیللا الله ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان ئەکات.

**١٣ - عبدالرحمن بن یزید** وتی : وترا بە **علقمة** - رحمه الله - :

بۆچی دانانیشت لە مزگەوت - خەڵکی - لەلات کۆببنەوە و پرسیارت لێ بکەن و ئێمەش لەلات دابنیشین، چونکە پرسیار لە کەسانێکی تر ئەکرێت؟

وتی : علقمة وتی : من ڕقم لەوەیە خەڵکی شوێنم بکەون و بڵێن ئەمە علقمة یە ئەمە علقمة یە!!

: علقمة رحمه الله قوتابی إبن مسعود ە رضي الله عنه، ئەم ڕیوایەتەش وەرع و ئیخلاص و ترسان لە فتوادانی علقمة پیشان ئەدات، والله أعلم.

**١٤ - لە مجاهد بن جبر** رحمه الله وە :

| وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا | (الفُرۡقَانِ : ٧٤)

وتی : لاساییان ئەکەینەوە و شوێنیان ئەکەوین، بۆ ئەوەی ئەوانەی پاش ئێمە شوێنمان بکەون.

: ئیمامی مجاهد خۆی تابیعی بووه هەر بۆیه مەبەستی له (لاساییان ئەکەینەوە و شوێنیان ئەکەوین) هاوەڵانە رضي الله عنهم.

## ١٥ - له مجاهد بن جبر رحمه الله وه :

| وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ | (مَرْيَمَ : ٣١)

وتی : فێرکەری چاکه.

---

: واته له هەر شوێنێک بووم وام لێ بکه خەڵکی فێری کاری چاکه بکەم والله أعلم، بەوەش ئەتوانیت خەڵکی فێری چاکه ئەکەیت که خۆت یەکەمجار هەوڵی بۆ بدەیت و فێری ببیت.

## ١٦ - الشعبي رحمه الله فەرمووی :

هیچ کەسێکم نەبینیوه له خەڵکی هێندەی مسروق پێداگر بێت لەسەر بەدەستهێنانی زانست.

---

مسروق بن الأجدع (٦٢ ه) تابیعی مخضرم، مەولا و تەلەبەی دایکی ئیمانداران عائشة رضي الله عنها.

## ١٧ - الأعمش رحمه الله فەرمووی :

إبراهیم - النخعي - باسی فەرز یان فەرموودەیەکی کرد، پاشان وتی : ئەمە لەبەربکه، لەوانەیه رۆژێک له رۆژان پرسیارت لێ بکرێت دەربارەی.

**١٨ - الأعمش** رحمه الله فەرمووی :

هەرگیز نەمبینیوە إبراهیم - النخعي - لەبارەی شتێکەوە بە ڕەئی خۆی قسە بکات.

**١٩ -** لە **سعید بن جبیر**ەوە رحمه الله :

| يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ | (النساء : ٣٧)

وتی : ئەوە لە زانست دایە.

---

: واتە ئەوانەی بەخیلی ئەکەن لە بڵاوکردنەوەی زانستی خۆیاندا و فەرمان بە خەڵکیش ئەکەن بە هەمان شت، والله أعلم.

**٢٠ - مکحول** رحمه الله ئەفەرمووێت :

ئەگەر دانیشتن و تێکەڵبوونی خەڵکی چاکەی تێدا نەبوو ئەوە تەنهایی باشترە.

**٢١ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

باشترین تەفسیرکاری قورئان إبن عباس ە رضي الله عنه.

**٢٢ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

لە زانستی کەسێک ئەوەیە کاتێک کە شتێکی نەزانی بڵێ : الله زاناترە (الله أعلم).

**٢٣** - **مسروق** رحمه الله ئەفەرمووێت :

پرسیاری هیچ شتێکمان نەکردووە لە هاوەڵانی محمد ئیللا عیلمەکەی لە قورئاندا هەیە، بەڵام ئێمە زانیاریمان لەبارەیەوە نییە.

: مسروق تابیعیە، قسەکەشی واتە ئێمە هەر پرسیارێکمان کردبێت لە هاوەڵان ئەوە وەڵامەکەی لە خودی قورئانەکەدا هەیە، بەڵام لەبەر کەمی شارەزایی ئێمە بە قورئان دەرک بەو وەڵامانە ناکەین، ئەمەش مانای وایە ئێمەش وەکو سەلەف بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکان ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی کە بە باشی شوێنیان کەوتوون لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە.

**٢٤** - **أبو الدرداء** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

فێرکاری چاکە و فێرخوازی چاکە لە پاداشتدا وەکو یەکن، لە دوای ئەوان خێر لە خەڵکی دیکەدا نییە.

: واتە بێکار دامەنیشە، یان فێری چاکە ببە یان خەڵکی فێری چاکە بکە.

**٢٥** - **إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

ئایا ئەزانن ڕۆشتنی زانست لەسەر زەوی چییە؟

وتمان : نەخێر.

وتی : بریتیە ڕۆشتنی زانایان.

**٢٦** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

شوێنکەوتە بن و داهێنان مەکەن، ئەوەندەتان بەسە، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە.

**٢٧** - **عبيد بن عمير** ئەفەرمووێت :

الله خێری بۆ هەر کەسێک بووێت تێگەیشتووی ئەکات لە دین، وە مۆفەقی ئەکات بۆ ئەوەی کاری پێ بکات.

**٢٨** - شێخێک لە عبس ئەفەرمووێت :

هاوەڵی سلمان - الفارسي رضي الله عنه - م کرد ویستم ئاگام لێی ببێت و شتی لێوە فێرببم و خزمەتی بکەم، جا هەر شتێکم بکردایە لەگەڵیدا ئەویش هەمان شتی ئەکردەوە لەگەڵم، گەیشتینە دیجلە و ئاوەکەی زۆر بوو، وتمان : ئەگەر ئاومان بە ئاژەڵەکانمان بدایە باش ئەبوو، جا ئاومان پێدان، منیش ئاوم خواردەوە، کاتێک سەرم بەرز کردەوە

وتی - واتە سەلمان - : ئای برای هۆزی عبس بگەڕێرەوە و بیخۆرەوە.

وتی : منیش گەڕام و خواردمەوە، لەبەر ئەوەی سەرپێچی نەکەم ئاوەکەم خواردەوە - ئەگینا تینووی نەبووە - .

وتی - واتە سەلمان - : چەندت لێ کەم کردەوە؟

وتم : الله رەحمەت پێ بکات خۆ بە خواردنەوەی من چەندی لێ کەم ئەبێتەوە؟

وتی - واتە سەلمان - : جا ئەو زانستەی وەریئەگری بە هەمان شێوەیە، تۆ هیچ لە زانستەکە کەم ناکەیتەوە، مادەم وایە ئەو زانستە فێربە کە سوودت پێ ئەگەیەنێت.

: زانست زۆره، بەتایبەتی لەمرۆدا، هەر چەندێک هەوڵ بدەیت هێشتا ناتوانیت هەموو زانستەکان فێرببیت، هەر بۆیە خۆت بە بەدەستهێنانی زانستی شەرعی سەرقاڵ بکە کە گرنگترینی هەموو زانستەکانە.

## ٢٩ - مسروق رحمه الله ئەفەرمووێت :

لەگەڵ هاوەڵانی رسول الله ﷺ دا دانیشتم، هەیانبوو وەکو ئەو جامە ئاوە وابوو کە یەک سواری تێرئاو ئەکات، هەیانبوو وەکو ئەو جامە ئاوە وابوو کە دوو سواری تێرئاو ئەکات، هەیانبوو وەکو ئەو جامە ئاوە وابوو کە دە سواری تێرئاو ئەکات، وە هەشیانبوو ئەگەر ئەهلی زەوی لێیان بخواردایەتەوە تێرئاوی ئەکردن، وە عبدالله - إبن مسعود رضي الله عنه - وەکو ئەو جامە بوو.

: واتە هاوەڵانی رسول الله ﷺ لە عیلمدا جیاواز بوون رضي الله عنهم، بەشێکیان زاناتر بوون لە بەشێکی تریان، وشەی الآخاذ شتێکە کە ئەوکاتە شتیان تێدا خواردووەتەوە، نەمزانی بە کوردیەکەی چییە نووسیم جام.

## ٣٠ - عبدالله إبن مسعود رضي الله عنه فەرمووی :

ئەگەر عیلمی عمر بن الخطاب رضي الله عنه بخرێتە تا ی تەرازوویەکەوە، وە عیلمی ئەهلی زەوی بخرێتە سەر تا کەی تر، ئەوە عیلمی عمر بن الخطاب رضي الله عنه قورسترە

## ٣١ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه - فەرمووی :

من وای ئەبینم کە عمر نۆ بەش لە دە بەشی عیملی پێ دراوە.

: تەماشا بكە رحمك الله إبن مسعود كە يەكێكە لە زاناترینی هاوەڵان رضي الله عنهم بەم شێوەیە وەسفی ئیمامی عمر رضي الله عنه ئەكات.

## ٣٢ - لە مجاهد بن جبر رحمه الله وە :

| أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ | (النِّسَاءِ : ٥٩)

وتی : ئەهلی فیقهـ و عیلم.

: ئیمامی مجاهد | وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ | ی بە ئەهلی عیلم تەفسیر كرد.

## ٣٣ - مسعود بن مالك ئەڵێت : علي بن الحسين پێی وتم :

ئەتوانیت بمگەیەنیت بە سعید بن جبیر؟

وتم : جا تۆ چ پێویستیەكت بە ئەو هەیە؟

وتی : هەندێ شت هەیە ئەمەوێت لەبارەیەوە پرسیاری لێ بكەم، خەڵكی بە شتانێک وەسفمان ئەكەن لە لەلامان نییە.

: علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب، ناسراو بە زين العابدين، لەگەڵ ئەوەی كە نەوەی ئیمامی علي ە و ئەهلی بەیت ە بەڵام پرسیار لە كەسێک ئەكات كە ئەهلی عیلمە هەرچەندە نەسەبی وەكو ئەم بەرز نییە.

**٣٤ - الأوزاعي** ئەفەرمووێت : گوێم لە **بلال بن سعد** - تابیعی - بوو وتی :

زاناکەتان نەزانە، زاهیدەکەشتان دنیاویستە، وە خواپەرستەکەشتان کەمتەرخەمە.

**٣٥ - عبدالرحمن بن أبي ليلى** ئەفەرمووێت :

ژیانەوەی فەرمووده بریتیە باسکردنی، باسی بکەن لە نێوان خۆتاندا.

عبدالله بن شداد وتی : ڕەحمەتی الله ت لێبێت چەندە فەرموودەی ناو سنگمت ژیاندەوە کە مردبوون.

**٣٦ - إسماعيل بن رجاء** ئەفەرمووێت :

ئێمە منداڵانمان کۆدەکردنەوە و فەرموودەمان بۆ ئەگێڕانەوە.

**٣٧ - مسروق** ئەفەرمووێت :

پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کعب کرد لەبارەی شتێک.

وتی : ئایا ڕوویداوە؟

وتم : نەخێر.

وتی : دەی وازمان لێ بهێنە هەتا ڕووئەدات، ئەگەر ڕوویدا قسەی خۆمانت لەبارەیەوە پێ ئەڵێین.

: ئەهلی سوننە و جەماعە لەو شتانە قسە ئەکەن کە ڕوویداوە، بە پێچەوانەی ئەهلی ڕەئی ەوە کە زۆر قسە ئەکەن دەربارەی ئەو شتانەی کە ڕووی نەداوە.

**٣٨ - زبید** وتی :

هەرکاتێک پرسیارم لە إبراهیم - النخعي - کردبێت ئیللا بینیومە کە پێی ناخۆش بووە.

**٣٩ - عطاء بن یسار** فەرمووی :

هیچ شتێک کۆنەبووەتەوە لەگەڵ شتێکی تر جوانتر بێت لە کۆبوونەوەی نەرمونیانی لەگەڵ عیلم دا.

**٤٠ - إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت :

کاتێک موسی قسەی لەگەڵ پەروەردگاریدا کرد وتی : ئەی پەروەردگارم کام بەندەیەت خۆشەویسترینە لەلات؟

فەرمووی : ئەوەی کە زۆرترین کات منی لەبیرە.

وتی : ئەی پەروەردگارم کام بەندەیەت خاوەنی باشترین بڕیارە؟

فەرمووی : ئەوەی کە بڕیار لەسەر خۆی ئەدات وەک چۆن بڕیار لەسەر خەڵکی ئەدات.

وتی : ئەی پەروەدگارم کام بەندەیەت دەوڵەمەندترینە؟

فەرمووی : ئەوەی ڕازیە بەوەی کە پێم داوە.

**٤١ - القاسم بن محمد** وتی :

ئەگەر پیاو بە نەزانی بژی لەوە باشترە فتوا بدات لەوەدا کە نایزانێت.

**٤٢ - الأعمش** رحمه الله ئەڵێت :

مجاهد پێی وتم : ئەگەر توانای ڕۆشتنم هەبووایە من ئەهاتم بۆلای تۆ.

---

: ئیمامی موجاهید یەکێکە لە باشترین تەفسیرکارەکانی قورئان لە تابیعیەکاندا، بەڵام لە ئاست قوتابیەکی وەکو الأعمش کە زۆر پێداگر بووە لە داخوازی عیلم بەم شێوەیە خۆبەکەمزانە.

**٤٣ - أيوب السختياني** رحمه الله وتی :

پیاوێک بە مطرف ی وت : ئێوە شتێکی باشترتان ئەوێت لە قورئان؟

وتی : نەخێر، بەڵکو کەسێکمان ئەوێت شارەزاتر بێت لە ئێمە بە قورئان.

---

: مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە بریتیە لە گەڕانەوە بۆ تێگەیشتنی هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون هەتا بە شێوەیەکی ڕاست لە قورئان و فەرموودە تێبگەن. چونکە باشترین تێگەیشتن بۆ ئیسلام بریتیە لە تێگەیشتنی سەلەف رحمهم الله تعالی.

**٤٤ - وهب بن منبه** ئەفەرمووێت :

لەسنوور دەرچوون - طغيان - لە عیلم دا هەیە وەک چۆن لە پارەدا هەیە.

: واته کەسی وا هەیە کە شتێکی کەم یان زۆر لە عیلم فێرئەبیت ئیتر لە سنووری خۆی دەرئەچێت و حساب بۆ کەس ناکات و لە هەموو شتێکدا قسە ئەکات، والله أعلم.

### ٤٥ - عطاء فەرمووی :

خەڵکی پرسیاریان لە أبو هريرة ئەکرد و ئەویش ئەیوت : ئەگەر ئەم ئایەتەی سورەتی البقرة نەهاتایەتە خوارەوە هیچ فەرموودەیەکم بۆ نەئەگێڕانەوە : | إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ | (البَقَرَة : ١٥٩).

### ٤٦ - فضيل فەرمووی :

من و إبن شبرمة و الحارث العكلي و المغيرة و القعقاع بن يزيد بە شەو کۆئەبووینەوە و باسی فیقهـمان ئەکرد، هەڵنەدەستاینەوە هەتا گوێمان لە بانگی بەیانی نەبووایە.

### ٤٧ - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی :

ئێوە لە زەمانێکدان زانای تێدا زۆرە و قسەکەری تێدا کەمە، لەدوای ئێوە زەمانێک دێت قسەکەری تێدا زۆرە و زانای تێدا کەمە.

: زانایانی سەلەف بەهۆی وەرع و لەخواترسانیان لە بابەتەکاندا بە کەمی و بەپێی پێویست قسەیان لە بابەتەکاندا کردووە هەرچەندە خاوەنی زۆرترین زانیاریش بوون.

**٤٨ - إبراهيم النخعي** ئەفەرمووێت :

هەر کەسێک داخوازی شتێک لە عیلم بکات لەپێناو الله دا عز وجل، ئەوە چەندی پێویست بێت الله عز وجل هێندەی پێی ئەبەخشێت.

**٤٩ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

ڕەحمەتی الله لەو کەسە بێت کە فەرموودە لە ئێمە ئەبیستێت، وە بەو شێوەیە ئەیگێڕێتەوە کە بیستوویەتی، لەوانەیە ئەو کەسەی کە فەرموودەکە ئەبیستێت تێگەیشتووتر بێت لەو کەسەی کە فەرموودەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە.

**٥٠ - عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

فێربوونی زانست بە هەوڵدانە، هیچ کەسێک بە زانایی لەدایک نابێت.

**٥١ - أبو هريرة** رضي الله عنه فەرمووی :

عیلم هەڵئەگیرێتەوە و جەهل دەرئەکەوێت و الهرج زۆر ئەبێت.

وتیان : الهرج چییە؟

فەرمووی : کوشتن.

**٥٢** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

الله تعالى عیلم هەڵناگرێتەوە بە سەندنەوەی لە خەڵکی، بەڵکو عیلم هەڵئەگرێتەوە بە مردنی زانایان، هەتا ئەگاتە ئەوەی هیچ زانایەک نامێنێت و خەڵکی نەزانەکان ئەکەن بە سەرگەورەی خۆیان، پرسیاریان لێ ئەکرێت و بەبێ عیلم فتوا ئەدەن، جا گومڕا ئەبن و خەڵکیش گومڕا ئەکەن.

**٥٣** - **أبي حصين** وتی :

چووم بۆلای إبراهيم - النخعي - پرسیاری بابەتێکی لێ بکەم.

وتی - واتە إبراهيم - : ئەرێ کەسێکی تر نەبوو جگە لە من پرسیاری لێ بکەیت؟!

: سەلەف رحمهم الله لە ترسی ڕیا و فتوادان حەزیان نەکردووە خەڵکی پرسیاریان لێ بکەن.

**٥٤** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

وای ئەبینم پیاو عیلمێکی بیر ئەچێتەوە کە پێشتر ئەیزانی بەهۆی گوناهێک کە ئەنجامی ئەدات.

**٥٥** - **القاسم بن محمد** وتی :

ئێوە پرسیاری شتێکمان لێ ئەکەن کە ئێمە نایزانین، والله ئەگەر بمانزانیایە نەمانئەشاردەوە، وە بە حەڵاڵیشمان نەئەزانی بیشارینەوە.

**٥٦** - **أبو هريرة** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

هەر کەسێک زانستێکی بەسوود بشارێتەوە ئەوە دەستی گرتووە بە لغاوێکی ئاگرینەوە.

**٥٧** - **علي بن أبي طالب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

پێتان بڵێم کێ بەڕاستی تێگەیشتووە، ئەوەی خەڵکی بێئومێد ناکات لە ڕەحمەتی اللّه، وە سەرپێچیکردنی الله لەلایان ئاسان ناکات، وە لەبەر ئارەزووی خۆی قورئان وازلێناهێنێت بۆ شتێکی تر، وە خێر لە عیبادەتێکدا نییە کە بە زانستەوە نەکرێت، وە خێر لە زانستێکدا نییە تێگەیشتنی لەگەڵدا نەبێت، وە خێر لە خوێندنەوەیەکدا نییە کە بیرکردنەوەی لەگەڵدا نەبێت.

**٥٨** - **إبن عمر** رضي الله عنه ئەفەرمووێت :

ئەی خەڵکینە پرسیار دەربارەی ئەو شتانە مەکەن کە ڕووینەداوە، چونکە عمر لەعنەت یان قسەی بە کەسێک ئەوت کە پرسیار دەربارەی ئەو شتانە ئەکات کە ڕووینەداوە.

---

: چونکە ئەوکات ئەبێت کەسی پرسیارلێکراو لە بابەتەکەدا بە ڕەئی خۆی یان قیاس قسە بکات، وە ڕەئ و قیاسیش ئەپێکێت و ناپێکێت.

**٥٩** - **حبيب إبن أبي ثابت** ئەفەرمووێت :

سوننەت وایە کاتێک پیاوێک فەرموودەی گێڕایەوە بۆ خەڵکی تەماشای هەموویان بکات و جیاوازی لە نێوانیاندا نەکات.

**٦٠** - **الشعبي** ئەفەرمووێت :

کە گوێم لە شتێک بوو ئەینووسم ئەگەر لەسەر دیواریش بێت.

**٦١** - **عبدالله إبن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی :

ئێوە لە خێردان هەتا زانست لەلای بەتەمەنەکانتان بێت، ئەگەر زانست لای گەنجەکانتان بێت بەتەمەنەکانتان لەسەریان قورسە لە گەنجەکانتانەوە فێر ببن.

**٦٢** - **علقمة** رحمه الله ئەڵێت :

ئەوەی لە گەنجیەتیدا گوێم لێ بووە وەکو ئەوە وایە لە وەرەقەیەکدا بێت و تەماشای بکەم.

---

: ئەمە نیشانەی بەهێزی لەبەرکردنی ئەم ئیمامە بەڕێزەیە، وە بەگشتی سەلەف لەبەرکردنیان زۆر باش بووە.

**٦٣** - **تابیعی عبدالله بن عبید بن عمیر** ئەفەرمووێت :

زانستی شەرعی ونبووی باوەڕداره، هەر کە شتێک فێربوو ئەیگرێتە خۆی وە هەوڵی بەدەستهێنانی زیاتر ئەدات.

**٦٤** - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت :

ئەوەی کە زانستێک ئەزانێت و بڵاوی ناکاتەوە، وەکو ئەو کەسە وایە کە الله ماڵ و سامانی پێداوە و خێری لێ ناکات.

**٦٥ - أنس بن مالك** رضي الله عنه فەرمووی :

رسول الله ﷺ چووە ناو مەککەوە و کڵاوێکی ئاسنینی لەسەردا بوو، کاتێک کڵاوەکەی لابرد پێی وترا : ئەوە إبن خطل ە خۆی هەڵواسیوە بە پەردەی کەعبەدا.

فەرمووی : بیکوژن.

**٦٦ - أنس بن مالك** رضي الله عنه فەرمووی :

رسول الله ﷺ ئەیفەرموو : یا الله پەنات پێ ئەگرم لە زانستێک کە سوودی نییە، وە لە کار و کردەوەیەک کە بەرز نابێتەوە، وە دڵێک کە خشوعی نییە، وە وتەیەک کە نابیسترێت.

**اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْمًا**

لینکی کەناڵ :

https://t.me/Hamam_alathari

https://t.me/salafyummat